# پەیامی رەمەزان




وتاری ماموستا :

عبد الصمد

الله یشفیه



نووسینەوەی :

أحمد

١٤٤٥هـ

# پەیامی رەمەزان




وتاری مامۆستا:

عبدالصمد

نووسینەوەی :

أحمد

١٤٤٥هـ

## پێشەکی :

**الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلَاةِ وَالسَّلَامِ عَلَى نَبِيِّنَا وَشَفِيعُ ذُنُوبِنَا مُحَمَّدْ وَعَلَى آلِهِ وَأَصْحَابِهِ وَمِنْ اِهْتَدَى بِهَدْيِهِ إِلَى يَوْمِ اَلدِّينِ ، امام بعد....**

**رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ [سورة طه]**

**اَللَّهُمَّ اِجْعَلْنَا مِنْ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ.**

**موسڵمانانی خۆشەویست (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) لەخودای پەروەردگار داواکرین کەوا ئەو میوانە بەڕێزە کە مانگی ڕەمەزانە بەخێر و خۆشی و سەلامەتی بۆ ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) بگێڕێتن وەخودای پەروەرگار وامان لێبکاتن کەوا توانامان هەبێ لەو مانگە پیرۆزەدا ئەوشتانەی کەوا لەسەری پێویست کردینە و ئەو سوونەتانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە بۆ ئوممەتەکەی دیاری کردووە لەو مانگەدا جێبەجێ بکەین ، خودای گەورە هەموو لایەکمان تەوفیق بدا و بۆمان ئاسان بکات و یارمەتی و هاوکاریمان بکات ، خودای گەورە لە گوناهی هەموو لایەکمان خۆش بێ ، خودای گەورە هەمووامان قەبوڵ بکاتن وەکو خزمەتکارێکی ئەو مانگە پیرۆزە .**

## تایبەتمەندیەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز:

خۆشەویستان دیارە ڕەمەزان یەکێکە لەو دوازدە مانگەی کە خودای گەورە لەناو ساڵدا دایناوە ، بەڵام هەروەکو دیارە چۆن خودای گەورە هەندێ کاتی پیرۆز و گەورە کردووە مانگی ڕەمەزانیش یەکێکە لەو کاتانەی خودا گەورە گەورەی کردووە و هەڵی بژاردووە و خێر و ئەجر و پاداشت و بەرەکەت و میهرەبانی زیاتر تێدا باراندووە وەک لە مانگەکانی تر ، لەو مانگەدا کەوا گەورەیی بەسە بۆ ئەو مانگە کە قورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە وەک خودای گەورە دەفەرمووێ :﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ [1]﴾ واتە : مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی پیرۆزی تێدا نێردراوەتە خوارەوە ، وە پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم جار کە خودای گەورە جبریل*( عَلَيْهِ السَّلَامُ )ی نارد بۆ لای لە شەوێک لەشەوەکانی ئەو مانگە پیرۆزە بوو ئەمە جگەلە لەوەی کە قورئانی پیرۆز لەلایەن خودای گەورە (ﷻ) لە شەوێکی مووبارەکی ئەم مانگەدا ناردرا خوارەوە بۆ (لوح المحفوض) ، مانگی ڕەمەزان بە تەواوی مانگی قورئانە ، لەگەڵ ئەوەشدا مانگ ڕەمەزان تایبەتمەندیەکی دیکەی هەیە کە خودای گەورە (ﷻ) واجبی کردووە لەسەر ئووممەتی پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا

[1] البقرة – ١٨٥

*جبریل : فرشیشتەیەکە کە لەلایەن خوداوە ڕاسپێردراوە بۆ ناردنی وەحی

بەڕۆژووبن کە خودا بۆمان باس دەکات لە ئوومەتەکانی پێش ئێمەش ڕۆژوو هەبووە وەک خودای گەورە (ﷻ) دەفەرمووێ :﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا﴾ واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان بە خودا و پێغەمبەر و ڕۆژووی دوو ایی هێناوە ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ﴾ خودای گەورە ڕۆژووی لەسەر ئێوە واجب(فەرز) کردووە ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ [1] ﴾ هەروەکو چۆن لەسەر میللەتان و قەومانی پێش ئێوە فەرز کراوە ، کەواتە ڕۆژوو عیبادەتێکی (مشترك)ە هاوبەشە لە نێوان ئاینەکان چ ئیسلام بێ چ یەهوودی بێ چ نەصرانیەکان بێ خودای گەورە ڕۆژووی لەسەریان فەرز کردووە بۆئەوانەی ئیماندارو باوەڕدارن ، لە ئوومەتی پێغەمبەریش (ﷺ) دیارە پێش ئەوەی خودای گەورە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرز بکات ڕۆژوو هەبووە بۆ ئوومەت بە تایبەت بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ، دیارە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە ساڵی (٢)ـی کۆچی واجب وفەرز کرا لەسەر ئوومەت ، بەڵام پێش ئەو تاریخ و مێژووە خودای گەورە ڕۆژووی بۆ موسمانان دیاری کردبوو وەکو ئیمامی موسلم خودا لێی ڕازی بێ لەفەرموودەیەکدا دەگێڕێتەوە لە دایکی ئیمندارانەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرموێتن : ( كَانَتْ قُرَيْشٌ تَصُومُ عَاشُورَاءَ في الجَاهِلِيَّةِ، وَكانَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ يَصُومُهُ، فَلَمَّا هَاجَرَ إلى المَدِينَةِ، صَامَهُ

[1] البقرة – ١٨٣

وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ[1]) واتە : قوڕەیشیەکان لە عاشووڕا (١٠مانگی محرم) بەڕۆژوو دەبوون لەسەردەمی نەزانی ، وە پێغەمبەریش(ﷺ) بەڕۆژوو دەبوو ، کاتێ هیجرەتی کرد (لە مەککەوە) بۆ مەدینە بەڕۆژوو بوو و فەرمانیشی دا (موسڵمانان)بەڕۆژوو بن ، (جا موسڵمانانیش تێیدا بەڕۆژووبوون ) ، کەواتە ڕۆژووپێش ڕەمەزان لەسەرئوممەت هەبووە لەدوای هیجرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککەوە بۆ مەدینە ، وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە لە عبداللە بن عباسەوە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ : (قَدِمَ رسولُ اللهِ (ﷺ) الْمَدِينَةَ فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ فَقَالَ مَا هَذَا قَالُوا هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللَّهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ فَصَامَهُ مُوسَى قَالَ فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ[2]) واتە: پێغەمبەر(ﷺ) کە هیجرەتی کرد هات بۆ مەدینە بینی یەهودیەکان لە ڕۆژی عاشووڕادا(١٠ محرم) بەڕۆژوو دەبوون پێی فەرموون : ئەوە چیە ئەو ڕۆژە ئەوانە تێیدا بەڕۆژوو دەبن وتیان : ئەوە ڕۆژێکی چاکە ئەوڕۆژەیە کە خودا (موسا)وبەنی ئیسرائیلی لەدەست دووژمنەکەیان (فیرعەون و قەومەکەی) ڕزگار کرد و موسا پێغەمبەریش ( عَلَيْهِ السَّلَامْ )بەڕۆژوو دەبوو ، پێغەمبەر فەرمووی : من

[1] أخرجه البخاري (١٨٩٣)، ومسلم (١١٢٥).

[2] أخرجه البخاري (٤٦٨٠)، ومسلم (١١٣٠) باختلاف يسير

**لە مووسا نزیک ترم لە ئێوە (پێغەمبەر ﷺ خۆی بەڕۆژوو بوو) وە فەرمانی دا کە ئەوانیش بەڕۆژوو بن .**

**کەواتە پێش مانگی ڕەمەزانیش ڕۆژوو لەسەر موسڵمانان بە تایبەتی کۆمەڵەی یەکەم کە ئیمنیان هێنا بە پێغەمبەر (ﷺ)هێنا هەبووە و بەڕۆژوو بوونە ، جا وەرگرتنی ڕۆژوو کە یەکێکە لە عیبادەتەکان دوو مەرجی سەرەکی هەیە تا خودا لێتی قەبوڵ بکات :**

**١ – الْإِخْلَاص : واتە : یەکلایی بوونەوە بۆ خودا وە هیچ نیاز و مەبەستێکی تری نەبێ لەو ڕۆژووە و عیبادەتەکانی تر.**

**٢ – الصَّوَابْ : واتە عیبادەتەکەت موافق و ڕێک بێ لەگەڵ سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ شەریعەتەکەی یەک بگرێتەوە و وەک یەک بن.**

**جابۆ ئەوەی عیبادەتەکانمان موافقی شەریعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێ و لەگەڵ سوونەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لەیەک ئاڵۆز نەبێ و تێک نەچێ پێویستە فێری ئەحکامەکانی عیبادەتەکان ببین چ(نوێژە – ڕۆژووە – حەجە – زەکات هتد.....) بۆیە بەبێ عیلم و زانین عیبادەت نابێتن و خودای گەورە قەبوڵی ناکا دەبێ بزانین پێغەمبەر(ﷺ) چۆنی کردووە وە لەڕێی ئەویش چۆن بە ئێمە گەیشتووە ئاوا عیبادەتەکانمان ئەنجام بدەین .**

## بەڵگەی واجبی ڕۆژووگرتن لە قورئاندا :

بۆ ئەوەی عیبادەتەکانمان موافقی سووننەتی پێغەمبەی بێ (ﷺ) دەبێ ئەحکامەکانی بزانین ، باشترین کەس یاخود ئەو کەسەی خۆشی بوێت خودای گەورە ئەوکەسانە نین کە پارە وپولی زۆربێ نەیفەرمووە ئەوەی کورسی ودەسەڵاتی هەبێ نا ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ : (مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ[1]) واتە : هەریەکێ خودای گەورە بیەوێ خێرو چاکەی لەگەڵ بکات (خۆشی بووێتن) شارەزای دەکات لە ئاین ، مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لێرەدا ئەوەیە کە خودا و ئاینی ئیسلامی پێ شارەزا بکات وعیبادەتەکانی موافقی سووننەتی پێغەمبەربی (ﷺ) ، جا ڕۆژووکە بەعەرەبی پێی دەگوترێ (الصَّوْم) یاخود (الصِّيَام) ماناکەی لە زمانەوانیدا لەگەڵ مانای زاراوە شەرعیەکەی لەیەکتری نزیکن ، (الصَّوْم) یا (الصِّيَام) لەعەرەبی یانی : (الْإِمْسَاك) واتە : خۆگرتنەوە جا لە هەموو شتێ لە زمانی عەرەبی (الصَّوْم) بۆ هەموو شتێ بەکاردێ کە خۆتی لێ بگریەوە وەک خودای گەورە (ﷻ) لەسەرزمانی مەریەم ( عَلَيْهِ السَّلَامُ ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ : ﴿إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا [2]﴾ واتە : من نەذرم کردووە بۆ خودای گەورە

---

١ أخرجه البخاري (٧١)، ومسلم (١٠٣٧)

٢ سورة مريم - ٢٦

ئەمڕۆ خۆم دەگرمەوە لە قسەکردن ، وە (الصَّوْم) لە زاراوەی شەرعیدا بریتیە لە (اَلْإِمْسَاك عَنْ اَلْمُفْطِرَاتِ مِنْ طُلُوعِ اَلشَّمْسِ إِلَى غُرُوبِ اَلشَّمْسِ بِنْيِةٍ تَعَبُّدُ لِلَّهِ تَعَالَى) واتە : خۆگرتن لە هەموو شتێ کە ڕۆژووی پێ دەشکێ لەگەڵ بەدیارکەوتنی ڕۆژ (لەبەرەبەیان) تا ئاوابوونی ڕۆژ(لە ئێوارەدا) بەنیەتی عیبادەت و پەرستنی خودای گەورە (دەبێ نیەتی عیبادەتی بۆ خودای تێدا بێ)، یانی ئەو مووسڵمانە لە بەیانی هەتا ئێوارەش با خواردن نەخوا و نەشخواتەوە و شەهەواتیش نەکات با جیماعیش نەکاتن ئەگەر عیبادەتی خودای تێدا نەکرد (کە فەرزە) یا بەنیەتی سووننەتی(وەک ئەوانەی پێغەمبەربەیانی کردووە بەڕۆژووبین تیایدا) نەیکرد بۆ شتێکی دیکە بەڕۆژووبوو نیەتەکەی بۆ خودای گەورە نەبوو ئەوە پێی ناگووترێ ڕۆژوو ڕۆژووگرتن ئەوەیە نیەتی لەگەڵ بیتن بۆ نزیک بوونەوەی لە خودای گەورە (ﷻ)،حوکمی ڕۆژوو گرتن وەکو باسمان کرد لە ئایەتەکە فەرزە لەسەر مووسڵمانان و ئیمانداران وەکو خودای گەورە دەفەرمووێ:﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ[1] ﴾ واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لەسەرتان نووسراوە کە بەڕۆژووبن ، هەرچەندە خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بەمانگی ڕەمەزان نەکردووە کە تێیدا بەڕۆژوو بین بەڵام خودای گەورە پاش ئەوەی لەقورئاندا دەفەرمووێ مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قورئانی

[1] البقرة - ١٨٣

تێدا دابەزیوە لەپاشیدا دەفەرمووێ : ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾[1] واتە : هەریەکێ ئەو مانگەی بینی با بەڕۆژوو ببێت ، جا مەبەستی خودای گەورە ئەوەیە لەو مانگە ژیا بەو مەرجانەی کە ئیسلام لەسەری داناون دەبێ بەڕۆژوو بیت تەنها مەبەستی ئەوە نیە مانگ بەچاوی خۆت ببینی یەکێکی تر ببینێ بەڵام کاتێ قەرار درا کە مانگ بنیراوە ڕۆژوو لەسەرت فەرز دەبێتن ، ئەمە وەکو ئایەت ڕوون بوویەوە کە فەڕزە لەسەرئوومەت .

## بەڵگەی واجبی ڕۆژوو گرتن لە سووننەتی پێغەمبەر (ﷺ) :

لە فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ) زۆرمان هەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی ئەوەی کردووە کە بەڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان لەسەرئوومەت فەڕزە وەکو طلحة بن عبيدالله ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ : ( أنَّ أعْرَابِيًّا جَاءَ إلى رَسولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ ثَائِرَ الرَّأْسِ فَقالَ أخْبِرْنِي ما فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ فَقالَ: شَهْرَ رَمَضَانَ إلَّا أنْ تَطَّوَّعَ شيئًا[2]) ئەعڕابیەک هاتە خزمەت پێغەمبەر و پرسیاری لێ کرد وتی ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێم بڵێ خودای گەورە لە ڕۆژوو چی لەسەر من فەڕز کردووە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : مانگی ڕەمەزانی لەسەرفەڕز کردووی (تیایدا بەڕۆژوو بیت) ئیللا ئەگەر بۆخۆت ڕۆژی تر

[1] البقرة – ١٨٥

[2] البخاري (١٨٩١)

بۆ سوونەت بەڕۆژوو بیت (دەنا تەنها مانگی ڕەمەزانت لەسەرفەرزە) ، وە لە فەرموودەیەکی تردا کە مەشهورە و لەوانەیە زۆربەتان گوێتان لێبووێ کە عبداللە ی کوڕی ئیمام عومەرگێڕاویەتیەوە خودا لێیان ڕازی بێ کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ) واتە : ئیسلام لەسەرپێنج کۆڵەگە بنیاتنراوە(درووستکراوە) (شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ) شایەدی هێنانی ئەوەی کە خودا تاک و تەنیایە بۆ پەرستن (بەخودایەتی ئەوڕازی بی) وە شایەدی ئەوەش بدەی کە محمد(ﷺ) پەیامبەری خودای گەورەیە ، (وَ إِقَامِ الصَّلاَةِ) وە پێنج نوێژیش لەڕۆژدا(نوێژ بکاتن) (وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ) وە زەکاتیش بدا (بەو مەرجانەی شەرع دیاری کردووە) ، (وَالْحَجِّ) وە حەجی ماڵی خودا (ئەگەر لەتوانات هەبوو ، (وَصَوْمِ رَمَضَانَ[1]) وە بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان یەکێک لەو پایانەی کە ئیسلامی لەسەر دامەزراوە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە وەک لەو حەدیثە هات کەواتە ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزان فەرزە لەسەر ئوومەت

[1] أخرجه البخاري (٨)، ومسلم (١٦)

## چۆن بزانین کەی مانگی ڕەمەزانە؟

لەڕێگای دوو شتەوە مانگی ڕەمەزانمان بۆ بەدیار دەکەوێ و ئیثبات دەبێت کە مانگی ڕەمەزانە :

یەکەم : بینینی مانگی ڕەمەزانە ، لە مانگی هیجریدا هەموو مانگەکان یان (٢٩) ڕۆژە یا (٣٠) ڕۆژە لەمانگی هیجری (٣١) ڕۆژ نیە بۆیە موسڵمانان لە (٢٩)ی مانگ(شەعبان) لە ئێوارەکەی تەماشای مانگ دەکەن ئەگەر مانگ دیار بوو ئەوا ڕۆژی دواتر دەبێتە ڕەمەزان ، وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَ أَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ) یانی ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن(لەڕەمەزان) وە ئەگەر«مانگی شەوالتان» بینی لە کۆتایی ڕەمەزان ڕۆژوو بشکێنن «یانی بیکەنە جەژنی ڕەمەزان» ، جا ئەگەرلەلایەن کەسەوە مانگ نەبینرا بەهەر هۆکارێک بێ (هەور بوو – تەڵخ بوو -هتد....) ئەوا هەنگاوی دووەم دەگرترێتە بەر

دووەم : دەبێ مانگی شەعبان بکەینە (٣٠) ڕۆژ «پڕ بێتن» ئەوجا ڕۆژی دوای ئەو دەبێتە ڕەمەزان و پێویستی بەمانگ بینین ناکاتن ، پاشان پێغەمبەر لە تەواوکەری فەرموودەکە دەفەرمووێ (فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ[1])واتە : ئەگەرغێم«تەڵخ» بوو «یان بەهەر سەبەبێکی ترمانگتان نەبینی لە (٢٩)ی شەعبان » ئەوا شەعبان بکەنە

[1] أخرجه البخاري (١٩٠٩)، ومسلم (١٠٨١) باختلاف يسير

(٣٠) ڕۆژ و تەواوی بکەن «دوای ئەو ڕۆژەی کە تەواوتان کرد دەبێتە ڕەمەزان ، جا ئەگەر مانگ بینرا شەرعەن دەبێ شایەدێک هەبێ بچێتە لای قاضی(حاکم)ــی ئەو مەنتیقەیە شایەدی بداتن کە مانگی بە چاوی خۆی بینیووە ، جا ئاگادار بە مانگی هیجری ئیسپات و جێگیر نابێ بە حیسابات یانی یەکێ حیساب بگرێتەوە بۆ مانگی ڕەمەزان و مانگەکانی تری هیجری وەک ئێستا دەبینیت (١٥ – ٢٠) ڕۆژ ماوە بۆ ڕەمەزان عولەمای فەلەک دەڵێن ئەو ڕۆژە ڕەمەزانە بە تەوەقووعی خۆیان جا ئەمە شەرعەن نایخوا و جێگیر نابێ ، چونکە هەقی بەسەر ئەوەدا نیە ئەوەتا خودا و پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان بەیان کردووین وەک خودای گەورە دەفەرمووێ ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ [1]﴾ هەر یەکێ ئاو مانگەی بینی با بەڕۆژوو ببێت(دەبێ ببینی) وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێ ( صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَ أَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ[2])ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن(لە ٢٩ شەعبان) وە ڕۆژووش بشکێنن ئەگەر (شەوالتان بینی) لەکۆتایی ڕەمەزان بیشکێنن ، کەواتە بۆمان ڕوون بوویەوە بە حیسابات نابێ بڵێین فلانە ڕۆژی تر ڕەمەزانە دەبێ مانگ ببینین و شایەدیش هەبێ جا چ پیاو بێ چ ئافرەت بێ بچنە لای قاضی و شایەدی بدەن وەک خودا (ﷻ)و پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان ڕوون کردنیەوە ، لێرەدا

[1] البقرة – ١٨٥

[2] أخرجه البخاري (١٩٠٩)، ومسلم (١٠٨١) باختلاف يسير

**دووبارە پرسارێک دێتە پێشەوە پرسیارەکەش ئەوەیە ئایا ئەگەر لە شوێنێک مانگ بینرا وە لە شوێنێکی تر مانگ نەبینرا دەبێ هەموو موسڵمانان بەڕۆژوو بن یان نا ؟**

**دیارە خۆشەویستان لێرە ئیختیلاف و ڕاجیاوازی هەیە لەنێوان عولەمایان ڕەحمەتی خودایان لەسەر بێتن هەندەکیان دەڵێن کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی ( صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَ أَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ[1] ) لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) بە گشتی و بە کۆ و جەمع باسی کردووە و باسی هەموو مووسڵمانان دەکاتن جا ئەگەر لەشوێنێک مانگ بینرا دەبێ هەموو موسڵمانان تەماشای ئەوان بکەن و بیکەن بە ڕەمەزان ئەگەر لەمانگی شەعبان بوون وە ڕۆژووش بشکێنن ئەگەر (مانگی شەوال)یان بینی لە کۆتایی مانگی ڕەمەزان.**

**هەندێکیش لە زانایان دەڵێن نا پێویست ناکاتن هەروڵاتێ شوێنی خۆیان هەیە بە تایبەتی ئەگەرهاتوو شوێنێک لەگەڵ شوێنێکی تر لە ڕۆژهەڵات کاتێ ڕۆژ هەڵدێ یان کاتی ڕۆژئاوا بوون ئیختیلاف و جیاوازیان هەبوو.**

**ڕای ئەصەح و پەسەند ئەوەیە موسڵمانان بۆ ئەوەی یەکیەتی و برایەتی و خۆشەویستی لەناویان زیاتر بێ و لەیەک نزیک ببنەوە وڕا جیاوازی نەبێ لە نێوانیان ئەوا وا چاکە لە شوێنێ مانگ بینرا شوێنەکانی تریش بیکەنە ڕەمەزان ئاوا چاکترە چونکە پێغەمبەریش(ﷺ) لە فەرموودەکەی**

[1] أخرجه البخاري (١٩٠٩)، ومسلم (١٠٨١) باختلاف يسير

**سەرەوە بە کۆ و بەگشتی باسی موسڵمانان دەکات نەیفەرمووە ئەگەرلە شوێنێ مانگتان بینی بیکەنە ڕەمەزان وە ئەگەرلە شوێنێکی تر مانگتان نەبینی نەیکەنە ڕەمەزان .**

## ڕووکنەکانی ڕۆژوو گرتن :

**دیارە خۆشەویستان هەر عیبادەتێک لە ئیسلامدا هەندێ ڕووکن و کۆڵەگەی هەیە کە مەرجە بێتە جێ ئەگەرنەیەتە جێ ئەوا وەرناگیرێ ، بۆنموونە نوێژ: سوورەتی فاتیحە لەناو نوێژدا نەخوێنی نوێژەکەت بەتاڵە و قەبوڵ نابێ وە ڕکوع و سوجدە و تەحیات خوێندن و سەلام دانەوەی یەکەم لە نوێژ بەهەمان شێوە ڕووکنن لەناو نوێژدا ئەگەر نەیانکەی ئەوا نوێژەکەت قەبوڵ نیە و وەرناگیرێ جا ڕۆژووش دوو ڕووکنی گەورەی هەیە کە مەرجە بێتە جێ بۆ ئەوەی وەربگیرێ :**

**١ – النِّيَة : نیەت هێنان بۆ هەموو عیبادەتێکی واجبە خودای گەورە بەبێ نیەت وەری ناگرێ وەک پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى[١]) واتە: هەموو عەمەل (عیبادەت)و کردارێک بەنیەتە پاداشتیش بۆ هەرکەسێك بەو نیەتەیە کە هەیەتی،**

[١] أخرجه البخاري (١)، ومسلم (١٩٠٧)

**جا هەموو عیبادەت و کردارێک بە نیەت و قەصدە بەبێ نیەت عیبادەت دانامەزرێ و قەبوڵ نابی ، بۆ ڕەمەزان تۆ دەبێ نیەتی ئەوەت هەبێ کە ئەوە مانگی ڕەمەزانە و فەڕزە لەسەرت کە تێیدا بەڕۆژوو بیت جا ڕۆژوو دوو جۆری هەیە فەرز و سوونەت فەڕزەکە مەرج نیە تەنها لە ڕەمەزان بێ لە ڕۆژی تریشدا ڕۆژوو فەرزە بۆ نموونە کەسێکی ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزانی بە هەڵە خواردووە دوای ڕەمەزان فەڕزە بیگرێتەوە یان کەسێکی ترکە کەفارەتی لەسەرە بەهەر جۆرێکی بێت کە لە شەریعەتی ئیسلامدا هاتووە وە لە ڕۆژووی سوونەتیش دەبێ بهێنی ، جا پرسارێک کە زۆر دووبارە دەکرێتەوە ئەوەیە کەوا ئایا بۆ هەر شەوێک بەجیا نیەت بێنم بۆ ڕۆژووی بەیانی یان پێش ڕەمەزان نیەتێک بهێنم بۆ کیفایەت و تەواوی مانگەکە کە تێیدا بەڕۆژوو ببم..؟**

**لێرەشدا عولەما ئیختیلاف و ڕا جیاوازیان هەیە هەندێکیان دەڵێن دەبێ بۆ هەموو شەوێک نیەتێکی جیا بهێنیت بۆ ڕۆژووی بەیانی ئەمە مەزهەبی جمهووری عولەمایە امامی شافعی و امامی ابی حنیفە و امامی مالک و قەولێک لە مەذهەبی امام احمد هەیە وە خەڵکی تریش لەسەر ئەوەنە کەوا هەموو بۆ هەموو شەوێک نیەتێک واجبە ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت : (مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ[1]) واتە :**

[1] أخرجه أبو داود (٢٤٥٤)، والترمذي (٧٣٠) واللفظ لهما، والنسائي (٢٣٣٣)

**هەریەکی پێش بەیانی نیەت نەهێنێتن بەڕۆژوو دەبێ ڕۆژووەکەی قەبوڵ نیە و بەتاڵە ، کەواتە بۆ هەرشەوێ نیەتێک واجبە**

**بەڵام قسەی ترمان هەیە لە امام احمد و امام مالك ڕەحمەتی خودای لەسەربێ دەڵێن : ئەگەر لە سەرەتای مانگی ڕەمەزان نیەت بهێنی کەوا ئەو مانگە بەڕۆژوو دەبیت ئەوا بۆت کافیە و تەواوە و پێویست ناکات بۆت نیەتی تربهێنی ، دیارە ئەوەش ڕەحمەتە بۆ ئوومەتی پێغەمبەر(ﷺ) . جا خۆشەویستان نیەت شەرت نیە لەوکاتەی کە هەڵدەستی بۆ پارشێو نیەت بهێنی بەدەم نا ، دیارە مرۆڤ کە هەڵدەستێ بۆ پارشێو ئەوە خۆی لەخۆی نیەتە بۆ ڕۆژوو گرتن یان وەک دەست نوێژ کە مرۆڤ دەچێ دەست نوێژ بشوات لەوانەیە نیەتی نەهێنابێ نە بەدەم نە بە دڵ بەڵام خۆ ئەو حەرەکە و جوڵانەوە لە دەستنوێژەکەیدا کە دەست و دەموچاو قاچ وهتد.. دەشوات ئەو دەستنوێژ شووشتنە عیبادەتێکە کە ئەمانەی کرد ئەوە خۆی لە خۆیدا کافیە بۆ نیەتەکەی دەست نوێژ ئاشکرایە کە دەیەوێ دەست نوێژ بشوات و هیچ عیبادەتێک و شتێکی ترمان نیە وابێت ، کەواتە کە تۆش هەڵدەستی بۆ پارشێو و نان دەخۆی ئەوا بەنیەتی بەڕۆژوو بوون بۆت حیسابە ،**

**٢ – الإمْسَاكُ عَنِ المُفَطِّرَاتِ : ڕوکنی دووەم لە ڕۆژوو گرتن بریتیە لە خۆگرتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن وەک ( خواردن و خواردنەوە و جیماع کردن) ڕۆژوو تەنها بەو سێ شتە دەشکێ لەغەیری**

**ئەوە هیچ شتێک ڕۆژوو ناشکێنێت، دیارە خواردن و خواردنەوە لەو شوێنانە بچێتە ژوورەوە بۆ ناو لاشەی ئینسان کە پێی دەوترێ :(المعتبر شرعا) یانی ئەو شوێنەیە کە شەرع دایناوە خواردنی پێدا دەچێتە ژوورەوە وقازانجی لێ بکات (تامی بکا و تێربێ) جا بەشەکانی بریتین لە ( دەم – دامێنی پشت و پێشەوە – گوێ – چاو - لووت) ئەمانە ئەو شوێنانەن کە شەرعەن خواردن و خواردنەوەی پێدا بچێتە ژوورەوە و ئاودیو بێ ڕۆژوو دەشکێنی ، غەیری ئەو پێنج شوێنە شوێنی تر ڕۆژی پێ ناشکێ بۆ نموونە:( کەسێک لەڕێگای دەمارەکانیەوە بە مغەزی ئاویان بۆ تێکردە ناو مغەزیەکە چووە ناو لاشەی یان کەسێکی تر خوێنیان پێیدا و بەڕۆژووش بوو ) ئەمە تەئسیری لەسەر ڕۆژیەکەی ناکا چونکە ئەو شوێنە (المعتبر) نیە شەرعا واتە ئەو پێنج شوێنە نیە کە شەرع دایناوە ، ڕاستە لەڕێگەی مغەزیەکەوە خۆراکیان پێیدا بەڵام هەست بە تێری ناکات لەخواردن و خواردنەوە ، کەواتە بە دەرزی لێدان بەدەرمان وەرگرتن ئەمانە ڕۆژووی پێ ناشکێتن پەیوەندی پێوە نیە چ خوێن وەربگری چ مغەزی بەکاربێنیتن ئەمانە ڕۆژووی پێ ناشکێتن ، بە نسبەت جیماع کردنیش کە پیاو لەگەڵ ژنی خۆی دەیکات کە حەڵاڵی یەکترن یا خوا نەخواستە(نعوذ بالله)خودای گەورە بمان پارێزیتن جیماعی ناشەریعیش(زینا) هەرڕۆژووی پێ دەشکێت چونکە لە زیناکە کابرا لەناو تاوان گوناهە،وە ئەو مەجالەی کە شەرع دایناوە بۆژن و پیاوێکی حەڵاڵی**

یەکترین بەپێی ئەوەی کە بە جیماع حیساب دەکرێتن هەر یەکەو حوکمێکی تایبەتی هەیە ، هەندێکیان دەڵێن ئەگەرهاتوو پیاوەکە بەزۆر بیەوێ جیماع بکات لەگەڵ ئافرەتەکە وە ئافرەتەکە پێی ڕازی نەبێ کەفارەتەکە تەنها لەسەر ئافرەتەکەیە بەڵام ئیجماع و کۆدەنگی جمهووری عوولەما لەسەرئەوەیە کە کەفارەتەکە لەسەرهەردووکیان دەکەوێ چونکە کارەکە کە دەیکەن هەردووکیان بەشدارن و کاریگەری هەیە لەسەر ڕۆژووی هەردووکیان کەواتە هەردووکیان پێویستە کەفارەت بدەن قەولی اصح وڕاست ئاوایە ،

جا کەفارەتی ئەوەی کە ئەو ژن و پیاوە بیدەن ئەوەیە کە خودا دەفەرمووێ : ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا[1]﴾ واتە : ئەوها پێویستە بەندەیەك ئازاد بکەن لە پێش ئەوەی بەیەك بگەن بەم کەفارەتەی(کە لەسەرتان پێویست کراوە) ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ۖ فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا[2]﴾ ئینجا ئەگەریەکێك (بەندەی) دەست نەکەوت ئەوە با دوو مانگ بەڕۆژوو بێت لەسەر یەك پێش ئەوەی بچنە لای یەك ئەگەر یەکێك نەیتوانی (دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت) ئەوە با نانی شەست هەژار

[1] سورة المجادلة – ٣

[2] سورة المجادلة – ٤

بدات ئەو (کەفارەتانە کە لەسەرتان پێویست کراوە) ، جا ئەگەر ئەوانەشیان لەتوانادا نەبوو
بیکەن ئەوا لەگەردەنیان دەمێنێتەوە و دەکەوێتە سەر ویستی خودای گەورە لە ڕۆژی دوو ایی ئایا لێیان خۆش دەبێ یان نا ، وە کابرایەک هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی یا رسول الله (ﷺ) بەهیلاک چوومە فەرمووی چیت کردووە وتی لەڕەمەزاندا چوومە لای ئافرەتی خۆم (جا پێغەمبەروەک ئایەتەکە بۆی ڕوون کردووە ) فەرمووی : دەبێ دوو مانگ بەڕۆژوو بی کابرا گوتی یا رسول الله (ﷺ) من ڕەمەزانان بە زەحمەتی دەگرم ناتوانم بەڕۆژوو ببم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەنا دەبێ نانی (٦٠) فەقیر بدەیت و تێریان بکەیت (هەریەکێ ژەمێکیان پێ بدەی) کابرا گوتی لەمن فەقیرتر نیە ناتوانم دەستکوورتم ، دوای ماوەیەک موسڵمانێک هەندێ خوورمای هێنا لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) داینا و گوتی ئەمە بکە خێر بۆ هەژاران جا پێغەمبەر (ﷺ) نەیزانی کابرا لە مەجلیسەکە ماوە فەرمووی ئەوە کێ بوو پرسیاری دەکرد لەسەرجیماع بانگ بکەن جا کابرایەکە هات و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەو خوورمایە ببە بیدە بە (٦٠) فەقیران (هەژاران) لە مەدینە کابراش وتی قەسەم بەخودا لەشاری مەدینە لەمن هەژارتر نیە پێغەمبەریش (ﷺ) زەردەخەنەی کرد و ددانی مووبارەکی بەدیارکەوت و فەرمووی : بۆخۆتی ببە و بیدە بە منداڵەکانت . ئەوەی کە جیماع دەکات لەگەڵ ئافرەتــی

حەڵاڵی خۆی بێجگەلە ئەوەی دەبێ کەفارەت بدات دەبێ ڕۆژووەکەش بەجیا بگرێتەوە دوای ڕەمەزان ،

## ئایا کێ عوزری بۆ هەیە تا بەڕۆژوو نەبێ؟

دیارە ڕۆژوو گرتن لەسەر موسڵمان واجبە وەک ڕوونمان کردەوە لەسەرەوە بۆیە ئەوەی کافر بێت لەسەری نیە بەڕۆژوو بێت تا ئەوکاتەی دێتە ناو ئیسلام وتەکلیفی دەکەوێتە سەر کە بەڕۆژوو بێت ، جا ئەو کەسانەی بەڕۆژوو دەبن دەبێ موسڵمان بن و باڵغ بووبن وە تەواو و ساغیش بێت وە کافر و مناڵ و (ئەو مەخلوقە جوانانەی خودا کە وەک ئێمە نین و خودای گەورە ئەقڵی پێنەداون و بەشێت ناسراون ) ڕۆژوویان لەسەر نیە ، جا ئەو دووکەسەی کە خودای گەورە عەفووی کردوون لەو ئایەتە : ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ[1]﴾ بریتین لە نەخۆش و موسافر(ڕێبوار) ، جا موسافر (ڕێبوار) بەو مەرجانەی شەرع دایناوە کە دەبێ لەسەفەرێکی خێر و چاکە و حەڵاڵدا بێت نەک لە سەفەرێکی حەرامدا بێت و لەناو تاوان گوناه بێت ، وە ئەوەشی کە بەڕۆژوو دەبێت و لەسەفەریشە ئەوا خێری زیاترە ئەگەر بتوانێ و خۆی هیلاک نەکات وەک خودای گەورە لە کۆتایی ئایەتەکە

[1] سورة البقرة - ١٨٤

**دەفەرمووێ : ﴿وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ[1]﴾ و اتە : ئەگەر (نەخۆش بن یا لە سەفەربن) بەڕۆژووبن باشترە بۆتان ،**

**سەبارەت بە نەخۆشیش خۆشەویستان نەخۆشیەکە دەکرێتە چەند بەشێک: هەندێ نەخۆشی هەیە کاتیە و بۆماوەیەکی کەمە چەند سەعاتێکە یان چەند ڕۆژێکە دوای چاک دەبێتەوە بەڵام ئەگەر هاتوو زۆرزۆر بێتاقەتی کرد و لە تاقەتی ئەو انسانە چوویە دەرێ کە بەڕۆژووە دەتوانی بیشکێنی بەڵام دوای ڕەمەزان بیگرێتەوە ، وەبەشێکی تری هەیە هەتا هەتاییە (مزمن)ی پێ دەڵێن تا لەدنیا دەردەچێت ئەونەخۆشیە هەر لەگەڵیەتی وە دکتۆری موسڵمان پێی گووتبوو ڕۆژووبۆتۆ خراپە و نابێ بەڕۆژوو بیت ئەوا دەتوانێ بەڕۆژوو نەبێ بەڵکو لەسەری واجبە ڕۆژوو نەگرێ ئەگەر زانی هیلاکی دەکا بەڵام دەبێ فیدیە بدات وەکو خودای گەورە باسیانی کردووە : ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ[2]﴾ و اتە : ژەمە خواردنێ هەرڕۆژێ دەدات بە فەقیرێک ، وە ئەو مامە و دایە پیرانەی کە عومریان زیادی کردوە لە حاڵەتی تەبیعی ئینسانی ناتوانن بەڕۆژوو بن ئەمانەش هەمان حوکمی نەخۆشی (مزمن)ـیان هەیە و بەڕۆژوو نابن ڕەمەزان کۆتایی پێ هات لەباتی هەرڕۆژێک فیدیە دەدەن (وەکو وتمان ژەمە خواردنێکی فەقیرێکی دەدەن)**

---

[1] سورة البقرة – ١٨٤

[2] سورة البقرة – ١٨٤

## ئایا ئەوانەی کاردەکەن بەڕۆژوو بن؟

موسڵمانان ئەگەر دەتوانن با لەو مانگەدا ئیش نەکەن ئەگەر دەزانن ژیانی هەروەک خۆیەتی با کەسابەتەکە نەکات عیبادەتەکە لەپێشترە بەڵام ئەگەر مەعیشەت و ژیانیان لە ناخۆشی و نالەباریدا بوو دەبایا ئیشەکە بکاتن لەبەرماڵ و منداڵی ئەوا دەبێ بۆ پاشێو هەڵبستێ نیەتی ڕۆژووگرتن بێنێ وەک باسمان کرد و نان بخوا و بەڕۆژوو بێ جا لە ڕۆژدا لەهەرکاتێ بێتاقەت بوو وکارەکەی لە تاقەتی ئەودەرچوو وزانی تووشی هیلاکی دەبێ ئەوا دەبێ ڕۆژووەکە بشکێنێ و دوای ڕەمەزان تەعویزی بکاتەوە و بیگرێتەوە ، بەڵام نابێ یەکێ کرێکاربێ یان ئیشەکەی ناخۆش بێ هەرلە سەرەتای ڕەمەزانەوە بەڕۆژوو نەبێ و وازی لێبێنێ کەئەننەما لەلای ڕەمەزان نیە بەڵکو دەبێ بۆپارشێو هەڵبستێ و نان بخوا وبەڕۆژوو ببێت هەتا لەڕۆژ تاقەتی نامێنی ئینجا بیشکێنێ

## سووننەتەکانی ڕەمەزان :

١ – السّحُور: واتە پارشێو کردن کە سووننەتێکی گەورەی پێغەمبەرە (ﷺ) موسڵمانان نابێ نەیکەن یا لەبیری بکەن ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ : (تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السُّحُورِ بَرَكَةً[1]) واتە : پارشێو بکەن چونکە لەپارشێودا بەرەکەت هەیە، انسان لە ڕۆژدا بەهۆی ئەوپارشێوە

---

[1] أخرجه البخاري (١٩٢٣)، ومسلم (١٠٩٥)

لەڕۆژدا تاقەتی دەبێت و برسی نابێت وزەی لێ وەردەگرێ زۆر ئا ئەوە بەرەکەتەکەیە ، وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ : (فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ[1]) جیاوازی ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی ئەهلی کیتاب (جولەکە و دیانەکان) خواردنی پارشێوە (کە ئەوان نایکەن) ، جا خۆشەویستان سحور و پارشێوی تەواو ئەوەنیە لە سەعات دوازدە و یەک و دوو نان بخۆیت و بخەویتەوە نا وانیە سحور و پارشێوی تەواو ئەوەیە پێش بەرەبەیان بە نیو سەعات بیست دەقە انسان شتێک بخوات ئینجا داخلی سووننەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەبێتن و بە سووننەت بۆی حساب دەبێ ، هەتا صەحابەی پێغەمبەر (ﷺ) لەوە دەترسان بە پارشێو ڕانەگەن چوونکە پێغەمبەر(ﷺ) شەو نوێژی ئەوەندە دوورو درێژ دەکردەوە تا نزیک کاتی بەربانگ ، وە دووبارە وا سووننەتە کە ئەو پارشێوە تاخیر بکەی درەنگ بیکەی وەک لە صەحیحی بووخاری و مووسلیم هاتووە دەفەرموون: (تسحَّرْنا معَ رسولِ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليهِ وسلَّمَ ثمَّ قمنا إلى الصَّلاةِ قلتُ كم بينَهما قالَ قدرُ قراءةِ خمسينَ آيةً[2]) لە لای پێغەمبەر ﷺ پارشێومان دەکرد و بۆ نوێژێک دەچووین وتیان نێوانی نوێژەکە و پارشێوەکە چەند

---

[1] صحيح مسلم(١٠٩٦)

[2] أخرجه البخاري (٥٧٥)، ومسلم (١٠٩٧)، والترمذي (٧٠٣)، والنسائي (٢١٥٥)، وابن ماجه (١٦٩٤) واللفظ له، وأحمد (٢١٧١٥)

**بوو فەرمووی بەقەدەرپەنجا ئایەتی قورئانی کەوا بیخوێنی ( جا پەنجا ئایەت کە بە تەرتیل و تەجوید و بە جوانی ) بیخوێنیت تەقریبی بیست و پێنج دەقە نیو سەعاتێکت پێ دەچێت کەوایە نیو سەعات پێش بانگ پارشێو بکات ئەوا زۆر باشە ، وە ئەو (ئیمساک)ـەی کە ئێستا دەکرێت دە دەقە یان پێنج دەقە پێش بانگ دەکرێتن بۆ ئەوەنیە کە تەواو دەبێ خواردن و خواردنەوە لەخۆت حەرام بکەی و دەست لە نان خواردن هەڵبگری نەخێر خۆی دەبێ لەو کاتە بخوردرێت و بخوردێتەوە وەک لەسەرەوە باسمان کرد کە سووننەتە ، وە پرسیارێک زۆر دەکرێت ئەوەیە کە زۆربەی کەس کێشەی لێ هەیە ئەوەیە دەڵێن لەکاتی نان خواردن نان لەناو دەممانە بانگی بەیانی دەدات ئایا خواردنەکە تف بکەینەوە یان بەردەوام بین لە خواردن ....؟**

**وەڵام : دەبێ ئەو خواردنەی ناو دەمت تەواو بکەی ئینجا جوابی بانگەکە بدەیەوە وەک پێغەمبەر دەفەرمووێت : (إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّدَاءَ) واتە : ئەگەر یەکێ گوێی لێبوو بانگدەر بانگ دەدا ، (وَالإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ) بەرداخەکە یان جامەکە لەدەستی بوو«ویستی بیخواتەوە» ، (فَلاَ يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ[1]) با داینەنێ تا بەتەواوی دەیخواتەوە و پێویستیەکەی خۆی تەواو دەکات(بەڵام هەرئەو شتەی لەدەستت دایە نەک زیاتر بخۆی) .**

[1] سنن أبي داود (٢٣٥٠)

٢ – تَعْجِيلُ الْإِفْطَار : سوونەتێکی تری پێغەمبەر (ﷺ) بریتیە لە زوو ڕۆژوو شکاندن لە ئێوارەاندا وەک پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ( لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ[1]) واتە : خەڵک هەر لەخێر و خۆشیدایە مادەم زوو فتار دەکەنەوە و ڕۆژوو دەشکێنن ، نەک وەکو ڕەو افیضیەکان نەیشکێنی تا ئەستێرە ببینی کەئەوان وا دەکەن نا نابێ ئەمە موخالەفەی سوونەتی پێغەمبەرە(ﷺ).

٣ – سوونەتێکی تری پێغەمبەر(ﷺ) بریتیە لە ڕۆژوو شکاندن بە خورما یان قەسپ و جۆرەکانی تری وەک ئەنەس دەفەرمووێ (ان رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يُفْطِرُعَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ فَعَلَى تَمَرَاتٍ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ[2]) واتە : پێغەمبەرﷺ بە چەند ڕووتەبێکی ئەگەر هەبا ڕۆژووکەی دەشکاند (کە زانایان دەفەرموون با یەک یا سێ یا پێنج بێ با تاکیش بێ کە ڕۆژووەکەتی پێ دەشکێنی) پێش ئەوەی نوێژبکات وە ئەگەرڕووتەب نەبا پێغەمەرﷺ بە قەسپی وشک ڕۆژووی دەشکاند ئەگەرنا چەند گۆمێک لە ئاوی هەڵدەگرت و ڕۆژووەکەی خۆی پێ دەشکاند (واتە: چەند فرێکی لە ئاو دەخواردەوە) ، جا ئێمە کە بەڕۆژوو دەبین چاومان زەعیف دەبێ،بەحوکمی ئەوەی توێنی و برسینە بەڵام ئەو خورمایەی کە

---

[1] صحيح البخاري(١٩٥٧) وصحيح مسلم(١٠٩٨)

[2] أبو داود (٢٣٥٦)، والترمذي (٦٩٦)، وأحمد (١٢٦٧٦)

**دەیخۆین لە زانستدا دەڵێت سوودی هەیە بۆ چاوو چاوبەقوەت دەکات بۆیە دیارە پێغەمبەر (ﷺ) لەبەلاش وای نەکردووە حەتمەن حیکمەتی تێدایە.**

**٤ – دوعا کردن : بەڕاستی خۆشەویسان هەندێ سووننەت هەیە ئێمە لەبیری دەکەین یا نایکەین ولەبیری خۆمانی دەبەینەوە ، وە سوونەتێکی تری پێغەمبەر (ﷺ) بریتیە لە دوعا کردن کە کاتێ فتاری کردۆتەوە دوعای کردووە وەک دەفەرمووێت (ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُمُ الصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ وَالإِمَامُ الْعَادِلُ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ[1]) سێ کەس دوعایان ڕەت ناکرێتەوە ڕۆژووگرێک تا ڕۆژوو دەشکێنێ وە پێشەوایەکی دادپەروەروە کەسێکی ستەم لێکراو ، جا پێویستە لەسەر موسڵمانان دوعا بکەن و داوا لە خودا بکەن ئیمانیان بپارێزی وە بیانخاتە بەهەشت و لە دۆزەخ بیانپارێزێ ، وە سوونەتیە ئەو دوعایە بکرێ (ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ[2]) واتە : تینویەتی ڕۆیی وە دەمارەکانیش پاس ئەوەی لەڕۆژدا وشک ببوون ئێستا وا تەڕ بوونەوە وە خودای گەورەش ئەگەرویستی لێیێ پاداشتەکەت بۆ دەنووسی ،**

**٥ – زۆر قورئان خوێندن : دیارە پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو کەسی خێرو چاکەی زیاترکردووە بە تایبەتی لەمانگی ڕەمەزان ،جبريل ( عليه السلام)**

---

[1] أخرجه الترمذي (٣٥٩٨) واللفظ له، وابن ماجه (١٧٥٢)، وأحمد (٨٠٣٠)

٢ اخرجة ابو داود (٢٣٥٧) والنسائى فى السنن الكبرى (٣٣٢٩)

لە ئاسمان دادەبەزی دەهاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی بۆ دەخوێند و پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ ئەو دەیخوێندەوە و مدارەسەیان دەکرد.

٦ – خێر و چاکەکردن : پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خێر و چاکەی کردوە لەو مانگەی هەتا عبداللەی کوڕی عەباس ( رَضِيَ اللهُ عَنْهُ ) دەفەرمووێ ( كان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّم أجودَ الناسِ بالخيرِ، وكان أجودَ ما يكون في شهرِ رمضانَ[1]) و اتە : پێعەمبەر (ﷺ) لەهەموو خەڵکی زیاتر خێری دەکرد بەتایبەتی لەڕەمەزان لەهەموو کەس زیاتر خێر و چاکەی دەکرد ، جا خێر و صەدەقە چاکە و پاداشتی زیاترە لە ڕەمەزان وە پێغەمبەریش(ﷺ) کە سوونەتێکی دانابێ مانگی ڕەمەزانە وەکو فەرزێک و ایە وە فەرزێکیش بکەی وەک ئەوە و ایە حەفتا فەرزت کردبێ

٧ – زمـان پاراستن : سوونەتێکی تری پێغەمبەر ئەوەیە کە زمانت بپارێزی لە غەیبەت و گوناه و بوهتان و جوێن و شتی ناشرینی دیکە بۆیە ئەمانە لەبیر بکەن و لایببەن و مەیکەن بۆ ئەوەی ئەجر و پاداشتی ئەو ڕەمەزانە بەتەواوی وەرگرن و لەخێرڕۆژووەکەشت کەم نەبێتەوە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت : (مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِوَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ[2]) و اتە : هەر یەکێ زمانی خۆی

[1] أخرجه البخاري (٦)، ومسلم (٢٣٠٨) باختلاف يسير

[2] أخرجه البخاري (١٩٠٣)، وأبو داود (٢٣٦٢)، والترمذي (٧٠٧) وغيرهم....

نەپارێزێ لە قسەی ناشرین و جنێو و غەیبەت کردن یان کردەوەی خراپ ئەوا خودای گەورە موحتاج نیە ئیشی پێی نیە با خۆی لە خواردن و خواردنەوە نەگریتن ( ئەو ئەزیەتەی بۆ چیە) ، کە لەبەیانیەوە خۆت لەخواردن و خواردنەوە و جیماع کە حەلاڵی خۆتە گرتۆتەوە (في سبيل الله) لەپێناوی خودای گەورەیە تا لێمان ڕازی بێت و لێی نزیک بینەوە جا ئێمەش نابێ بچین ئەو خێری ڕۆژیە بچوێنین و لەناوی ببەین بە غەیبەت و گوناه و تاوان و قسەی ناشرین جا موسڵمان هەر نابێ بەس لە ڕەمەزاندا زمانی بگرێ لە کردەوەی خراپ بەڵکو لە باقی مانگەکانیدا زمانی خۆی بگرێ لەپێناو خودادا بەڵام لەمانگی ڕەمەزان لەپێشترە و پێویستترە ، وە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ئەگەر لەڕەمەزان یەکێ مناقەشەی لەگەڵ کردی یان یەکێ لێت تووڕە بوو یان یەکێ شەڕی لەگەڵ کردی ئەوا بڵێ من بەڕۆژووم من بەڕۆژووم[1]) یانی ئینسان کاتێ بەڕۆژوو بوو هەموو شتێکی کۆتایی پێدێ نە وەختی غەیبەتە نە وەخت و کاتی جنێودان و قسەی ناشرینە ، موسڵمان دەبێ زمانی تەڕبێت بە زیکر و یادی خودای گەورە لەو مانگەدا بە (سبحان الله – الحمدلله – لا اله الا الله – الله اكبر - اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ – قورئان خوێندن – ئامۆژگاری خەڵکی – صوڵح کردن لەنێوان خەڵکی ) .

---

[1] أخرجه البخاري (١٩٠٤)، ومسلم (١١٥١) واللفظ له

## ئافرەتان لە ڕەمەزان :

باسێکی ترکە ئەوئافرەتانەی تووشی دەبن بۆیان نیە بەڕۆژووبن ئەویش ئەو ئافرەتانەن کە لەمانگی ڕەمەزاندا دەکەونە (الحیض) یانی سوڕی مانگانە یا لە (النفاس)دان یانی خوێنی پاش منداڵ بوون کە ساتێک دەخایەنیت یا چل ڕۆژدەخایەنیت ئەوا بۆیان نیە بەڕۆژووبن وواجبە لەسەریان بەڕۆژوو نەبن و حەرامە لەسەریان بەڵام دوای ڕەمەزان ڕۆژووەکەیان دەگێڕنەوە و دووبارە بەڕۆژوو دەبنەوە ، وەخودا وای داناوە کە ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا بێت یا لە خوێنی پاش منداڵ بووندا بێت پێویستە نە نوێژ بکات نە بەڕۆژوو بێت بەڵام دوای کە لێی تەواوبوو دەبێ ڕۆژووەکان لە کاتێکی تربیگرێتەوە بەڵام بۆنوێژەکە خودا عەفووی کردووە ولێی بووریووە ئەگەرقەزای نەکاتەوە .

وە ئەو ئافرەتانەی کە دووگیان و کۆرپەیان لە سکدایە ئەگەر هاتوو زانی خراپە و ئەزیەتە بۆ کۆرپەکەی یا بۆخۆی خراپە ئەوا پێویستە بەڕۆژوو نەبێتن .

وە ئەوئافرەتانەی کە منالی بچووکیان هەیە لە دوو ساڵ کەمترە و شیر دەدات پێیان و منداڵەکە تەنها شیری دایکی دەخوارد و شیری تری

نەدەخوارد ئەوا دایکەکە بۆی هەیە کە بەڕۆژوو نەبێت بەڵام ڕۆژەکان حیساب بکات و و دەبێ فیدیە بدەن نابێ ڕۆژوو بگرنەوە لەسەریان نیە تەنها (طعام المسكين ) دەدەن و اتە نانی فەقیرێک دەدەن بۆ هەرڕۆژێک.

## ئەو شتانەی کە وا دەزانرێ ڕۆژووت پێی شکاوە:

١ – ئەو کەسانەی کە بەیانییەکەی یا هەرکاتێکێ ترکە هەڵدەستن لە خەو و بەڕۆژوون جەنابەتییان لەسەر بوو یانی لەشیان پیس بوو یا لەشیان گران بوو ئەمە ڕۆژووی پێ ناشکێت تەنها خۆی دەشوات و غوسل دەکات لەبەرنوێژو شتی وا دەنا ڕۆژووی پێ ناشکێ.

٢ – وە ژن و پیاو انیش کاتێ ماچی یەکتر بکەن یا دەست گەمە لەگەڵ یەکتر بکەن ئەوا ڕۆژوویان ناشکێ بە مەرجێ دەبێ ئەمین بن لەوەی کە تووشی لەش پیسی نابن(ئاوی منداڵ بوونیان دانابەزی یا توشی جیماع کردن نەبن) بەڵگەش فەرموودەی دایە عائیشەیە ( رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ ) کەدەفەرمووێت : ( كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ، وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لإِرْبِهِ[١] )

٣ – وە خۆشووشتنیش ڕۆژوو ناشکێنی یا ئاوی بەفراوو سارد بەسەرت دابکەیت لەو مانگانەی کە گەرمە وەک تەمووز و ئاب بەمەرجێ نابێ بەهیچ شێوەیەک ئاو لە گوێ و لوت و دەمت بچێتە ژوورەوە،وە هەروها

[١] أخرجه البخاري (١٩٢٧)، ومسلم (١١٠٦)

پێغەمبەریش (ﷺ) ئاوی بەخۆی داکردووە و جلی تەڕکردووە ئاوی لە بیرەکان هێناوە و خۆی پێ فێنک کردۆتەوە.

٤ – وە شتێکی تر کە ڕۆژووی پێ ناشکێ بریتیە لە (مضمضة والاستنشاق) و اتە کاتێ کە دەست نوێژ دەشۆین ئاو لە دەممان وەردەین یا لە لوتمانی بکەین خاوێنی بکەینەوە یا گوێمان بەمەرجێ زۆر مبالغە و زیادەڕۆیی تێدا نەکەین و ئاوەکە ئاویدیوی ژوورەوە نەکەین بچێتە ژوورەوە وەک پێغەمبەر ئامۆژگاریمانی کردوە دەفەرمووێت : (بَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ إلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا[1]) و اتە زۆر ئاو لە دەم و لووتت وەربکە ئیللا کاتی بەڕۆژوو بووی (کەمتر) و ابکە (نەوەک ئاو بچێتە ژوورەوە لە لووت و گوێ و دەممەوە و ڕۆژووی پێ بشکێ).

٥ – وە شتێکی تر کە ڕۆژووی پێ ناشکێ بریتیە لەوەی ئەگەر ژنێک یان پیاوێک چێشتیان لێ دەنا تامی بکەن بزانن تامی چۆنە بەمەرجێ تەنها بە زمان تامی بکەن لە قورگیان نەچێتە خوارەوە.

٦ – وە ئامێری (بەخاخ)یش ڕۆژوو دەشکێنێ چونکە بێجگەلە ئۆکسجینەکە ماددەی فێنک کەرەوەی تێدا و زەڕەنگە ئەگەر لەسەر لاپەڕەیەک تاقیبکەیتەوە.

---

[1] اخرجه أبو داود (٢٣٦٦) واللفظ له، والترمذي (٧٨٨)، والنسائي (٨٧)، وابن ماجه (٤٠٧) مطولاً، وأحمد (١٦٤٢٧) باختلاف يسير

٧ – وە حیجامە و کەڵەشاخ و خوێندان و خوێن وەرگرتن نەکرێت چاکترە لە ڕەمەزاندا چونکە تووشی ضُعْف و بێتاقەتی دەکات دەنا ڕۆژووی پێ ناشکێ بەس نەیکات باشترە

٨ – وە (کل) لەچاوکردن وقەترەی چاووگوێ وە بۆن کردنیش ڕۆژووی پێ ناشکێ بەس بە مەرجێ ئەوقەترە وکلەو بۆنەکە داخلی ژوورەوە نەبێ و ئاودیو نەبێ واتە ئەگەر بەس بۆ دەرەوە بێ ڕۆژووی پێ ناشکێت یا کەسانێک کە بەڕێگادا دەڕۆن بۆنی ئاشیان بۆدێت یا هەر بۆنێکی تربێت ڕۆژووی پێ ناشکێتن

٩ – سیواک کردنیش ڕۆژووی پێ ناشکێ خۆشەویستان دیارە پێغەمبەر (ﷺ) گرنگی پێداوە وەک دەفەرمووێ (لَولا أن أشُقَّ علَى أمَّتي لأمرتُهُم بالسِّواكِ عِندَ كلِّ صلاةٍ[1]) واتە ئەگەر ئەزیەت نەبا لەسەرئوومەتەکەم فەرمانم دەکرد لەگەڵ هەموو نوێژێکی سیواک بەکار بهێنن ، جا سیواکیش بەڕاستی سودی هەیە پدوی انسانی پێ بەقوەت دەبێت و دەم و ددانی پاک دەبێتەوە وە بۆنی دەمی پێ خۆش دەبێ چاوی پێ بەقوەت دەبێ ئەمە هەمووی سوودی زۆر چاکن ئەمە جگەلەوەی سووننەتێکی گەورەی پێغەمبەرە (ﷺ) هەرچەندە لای ئیمامی شافعی دەڵێ باش نیە لەدوای نێوەڕۆوە سیواک بەکاربێنی تا ئێوارە بەڵام هەرلە

[1] أخرجه البخاري (٨٨٧)، ومسلم (٢٥٢) واللفظ له

**مەذهەبی ئیمامی شافعی هاتووە کە ئیمامی نەوەوەوی دەفەرمووێ ئیمامی شافعی لەبەرفەرمووودەی پێغەمبەر (ﷺ) وا دەڵێ کەفەرمودەکە وایە ( خِلْفَةُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ[1] )واتە : بۆنی دەمی بەڕۆژوویێک لە مسک خۆشترە لەلای خودای گەورە ، ئیمامی نەوەوەوی دەفەرمووێ : ئەوانە وا تێگەیشتوون کە ئەو بۆنە لە دەم دێتن بەڵام خۆی بۆنە ناخۆشەکە لە مەعیدەوە دێت ، وە ددان شووشتنیش هەمان حوکمی سیواکی هەیە بەڵام نابێ ئاو لە قوڕگەوە بچێتە ژوورەوە (وە دەبێ زوو دەمی پاک بکاتەوە ئەگەرمەعجونەکە تامی هەبوو )**

**١٠ – وە زانایان دەفەرموون : ئەگەرتف و بەڵغەم لە مەعیدەوە هاتە سەرەوە و هاتە دەرەوە جارێکی تر نابێ بیبەیتە ژوورەوە قوتی بدەیتەوە ئەگەرنا ڕۆژووت دەشکێ**

**١١ – وە ئەگەر مرۆڤ بەدەستی خۆی نەبوو ڕشایەوە ئەوا ڕۆژووی ناشکێ بەڵام ئەگەرخۆی خۆی بڕشێنێتەوە ئەوا ڕۆژووەکەی دەشکێتن و دەبێ دوای ڕەمەزان بیگرێتەوە وەک پێغەمبەروای فەرمووە .**

[1] أخرجه البخاري (١٩٠٤).

# کۆتایی :

**لەخودای گەورە دەپاڕێینەوە لە گوناهەکانمان خۆش بێت و قەڵەمی عەفوو بەسەرگوناهەکانمان دابێنێ وە بەبەرشەفاعەتی پێغەمبەرمان بێخیت (ﷺ) تەوفیقمان بدات و بۆمان ئاسان بکات کەوا مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بین و شەو نوێژ و طاعەت و عیبادەتی تێدا بکەین(امین) ، وە خۆشەویستان سوونەتی هەر گەورەی ڕەمەزان تەراویحەکانە کە لەیەکەم شەوی ڕەمەزانەوە دەست پێدەکات هەتا شەوی جەژن کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی بە ئیمانداران داوە بیکەین و صەحابە ڕەزای خودایان لەسەربیتن کردوویانە، وە وا سوونەتیە کە بە جەماعەتی بکرێت هەرچەندە لەماڵەوەش دەکرێت بەڵام لە مزگەوت باشترە بەجەماعەت بیکات کە پێغەمبەر دەفەرمووێ ئەگەر نوێژ بە جەماعەت بکەی(هی تەراویح ) کەئەنەما وەک ئەوە وایە تەواوی شەو قیام الیل و شەو نوێژت کردبێ ) جا تەراویح ٨ ڕکاعەتە وە ٣ ڕکاعەت ویتر دەکرێت**

**والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته**

**سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴿١٨٢﴾[الصافات]**